سەرەتایەك بۆ ناسینی

# فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوەکان



شيخ محمد ناصر الدين الألباني

نووسیویەتی



ئەبو موسلیم ئاریانی

وەریگێڕاوەو پەڕاویزی بۆ نووسیوە

لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر / هەولێر

## سەرەتایەک بۆ ناسینی

# فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوەکان

**شێخ محمد ناصر الدين الألباني**

نووسیویەتی



**من لم يعرف حديث رسول الله ﷺ**

**لم يميز بين صحيحه وسقيمه فليس بعالم**

**( داود بن علي )**

**ما من أحد يطلب الحديث إلاّ في وجهه نضرة لقول النبيّ ﷺ**

**( نضر الله أمرءاً سمع منّا حديثاً فبلّغه... )**

**( سفيان بن عيينة )**

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، وأشهد ان محمدا عبده ورسوله، }يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون{ (آل عمران:١٠٢)، }يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالاً كثيراً ونساءً واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا{ (النساء:١)، }ياأيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديداً يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزاً عظيماً{ (الأحزاب: ٧٠-٧١).

اما بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

وبعد:

## ڕێ خۆشکردن

بەڕێزان :-

ئەو نامیلکە وەرگێراوە بچووکەی بەردەست چەندین گرێ کوێرە و کۆت وزنجیری گومان و خەیاڵ گلاوی گەلاڵنە بووی نێو مێشك و بیری چەند کسانێك دەپسێنێت و لە ڕاڕای کردن و درِ دۆنگی نواندن لە ئاست پیشەی زاناو پێشەوایانی فەرموودە رزگاریان ئەکات و مایەی هۆشیار بوونەوەی موسڵمانانە لە ئایینەکەیان و گێڕانەوەیان لە تاوانی درۆ کردن بە دەم پێغەمبەری خواوە ﷺ.!!

(سەرەتایەك بۆ ناسینی فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەکان) بابەتێکە لە پێشەکی کتێبە بە ناوبانگ و نایابەکەی شێخ ناصر (سلسة الاحادیث الضعیفة والموضوعة وأثرها السيء في الأمة)(بەرگی /١) کردوومانە بە کوردي. و بە پێی پێویست و لە پێناوی چاکتر حالی کردنی خوێنەرانی خۆشەویست، چەند ڕوون کردنەوەیەکمان خستۆتە سەر و بە پێی ژێدەر (هامش) نووسیوومانە لەگەڵ پاشکۆیەك کە تێیدا حوکمی فەرموودە (لاوازەکان)مان ڕوون کردۆتەوە، جا ئومێدەوارین خوێنەرانی خۆشەویست سوودی لێ وەربگرن و لە دوعای خێر بێ بەشمان نەکەن {ان أريد الا الاصلاح ما استطعت وما توفيقي الا بالله عليه توكلت وإليه أنيب}.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين..

١٥ ذي القعدة ١٤١٦

هەولێر ـ برایەتی

# سەرەتايەك بۆ ناسينى فەرموودە لاواز وهەڵبەستراوەكان

لەو مەينەت و پشێوويیە شكۆدارانەی كە لە چەرخەكانی يەكەمينەوە بە سەر موسڵمانانەوە هات و يەخەی پێ گرتن، ئەويش بڵاوبوونەوەو تەشەنە كردنی فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەكان بوو، لە نێوانياندا و هيچ كەسێك لەوانە لێی دەرنەچوون ئەگەر چی زاناو چاو ساغانيشيان!! تەنها ئەوانەی كە خودای كار لەجێ ويستی لە سەر بوو، لە پێشەواو شارەزايانی فەرموودە: وهي تريش.....!!

ئەوە بوو، بڵاوبوونەوەی فەرموودە لاوازو دەست هەڵبەستراوەكان بووە هۆی بالكێشانی خراپە كاری و وێرای ئەوەش زەبرو زيانێكی زۆری دا لە (ئايينەكەمان) كە هەندێك لەو

لايەنانەی كە پەيوەستن بە بواری بيروباوەڕو بە باسی غەيبياتەكانەوەو، هەندێكی تريشيان لە بواری ياسادانان -شرع-ەوە بوو! بە ويستی خودای پەروەردگار لەو جۆرە فەرموودانە لە جێگای خۆیدا بۆ خوێنەرانی بەڕێز عەرز دەكەين[1] .

---

[1] مەبەست لەو فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوانەن كە لە نێو كتێبە ناياپە كەيدا ((سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة)) كۆی كردۆتەوە و ژمارەيان تا ئێستا گەيشتۆتە (٥) هەزار فەرموودە..!! سەيری ((منزلة السنة في الأسلام)) ل١٩، بكە..

ئینجا حیکمەتی خودای زاناو کار بە جێ وای پێویست کرد کە ئەحیلی ئـەو فەرموودەهەڵبەستراوانەی کە لە لایەن ئەوانەی کە بۆ مەرام و ڕازو خواستی پەنـهانی جۆراو جۆری خویان ولە پێناوی لە باربردنی ڕێزی موسـوڵمانان و لاڕێ کردنیـان، دروستیان کردووە، بێ ئەوەی کەسانێك هەبن پەردە لە ڕوویانـەوە ڕامـاڵێ و ڕووی ڕاستی بۆ گرزی موسوڵمانان ئاوەڵابکاتەوە...!!(٢)

(ئەوە بوو دەستەو کۆمەڵێکی بۆ ئەم کارە ڕەخساند) لەوانەی کە پێشەوایانی فەرموودەو هەڵگرانی دروشمی سونتەتی پاکی پێغەمبەری سـەروەرن ﷺ ئەوانـەن کـە

---

(٢) لەوەتەی بانگەوازی ئیسلام دەستی پێ کردووە، بۆ ڕێگای سەرفیرازی و ئاشنا بوون بـە ئـایینی ڕاستەقینە و بەرنامەی ژیان، نەیاران مرخمان لێ وە تیـژ کـردووە و کەوتوونەتـە دژایـەتی کردنـی موسڵمانان، و هەوڵیان داوە پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ سـوونەتی پـاکی پێغەمبـەر ﷺ لـە بنا، بەرن

و خۆشەویستی ئەو پەیامبەرە نـازیزە لـە نێـو دڵیـان برەوێننـەوە چونکـە هـەر وەکـو ئاشکراشـە، موسڵمانان ئایین لەو وەردەگرن بە ڕێگـای (ووتـەو کـردار و بڕیارەکـانی)یـەوە..!! بۆیـە ئـەوان شێوازێکی تریان گرتە بەر بۆ ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە، ئەویش نانەوەی گومـان و تـەم ومـژ بـۆ سەر فەرموودەکان و بگێڕەوەکان (ڕاوی) و تانەدان لە ئـەمینی و ڕاسـتگۆیی ئـەو ڕاویانـە بـوو، هەروەها ئەخشەیەکی بەر فراوانیان کێشا بۆ ڕماندنی ئەو کلتورە مەزنە، بـە هونـەرێك کـە رووی دەرەوەی توێژینەوەی زانستی بوو، و جەوهەر و ناواخنە کەشی بریتی بوو لە تێکدان و ... خراپەکاری..!! سەیری (مختصر مشكاة المصابيح) ل ١٤ بكة تحقيق (عبدالبديع صقر

پێغەمبەری خوا ﷺ دەرحەقیان فەرموویەتی (نضر الله امرا سمـــع مقـــالتي فوعاهـــا وحفظها و بلغها ، فرب حامل فقه الى من هو أفقه منه) أخرجه أبو داود والـــترمذی والسياق له وابن حبان في ((صحيحه)) عن ابن مسعود . وەئەو فەرموودەیـە لەلایـەن چەندان هاوەڵانەوە هاتووە [٣] .

واتە خودا ئەو مرۆڤە چاو ڕۆشن بکات، کـە ووتەیـەك لـە ئێمـەوە دەبیسـێ و (دەرکی پێ ئـەکات و دەرخـی دەکـا و دەیپـارێزێ ) هـەروەها وەکـو خـۆی دەیگەیەنێ!! لەوانەیە ئەوەی پێی دەگات هۆشمەندتر بێ لـەوەی دەیگەیـەنێ....!!. ئینجا ئەو پێشەوا بە ڕێزانە – خودا پاداشتی چاکەیان بداتـەوە – هەڵسـان بـە ڕوون کردنەوەی بـارو دۆخـی زۆربـەی فـەرموودەکان لـە ڕووی تـەواوی (صحيح)[٤] و

---

[٣] واتە: فەرموودەیەکی (متواترة)ە:
ژمارەی ئەوانەی ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە – زیـاتر لـە بیسـت (٢٠) – هـاوەڵ دەبێت[ ڕەزای خوایان لێ بێ]  کە بە هەموو ڕێگاکانییەوە هەمان مانا دەبەخشن/ سەیری (نظم المتناثر في الحديث المتواتر) ل٣٣ هي (الكتاني) و ((ثلاث رسائل في علوم الحديث)) ل٧ (علي حسن علي عبدالحميـــد الأثري) بکە.

[٤] فەرموودەی تەواو ـ ساغ ـ بەو فەرموودانە دەووترێـت کـە هـەموو بگێڕەوەکـانی باسـکراین و لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکی ڕاست و زەبتکارین لـە هـەر چینێـك لـە چینـەکانیان، و هـەروەها بـە سەنەنەدێکی پەیوەست و نەپچڕاو گێڕابیتیانەوە، بێ ئەوەی ناوێزەو ڕێزپەڕیان دەردێکـی تێـدا بێ.. ((الباعث الحثيث)) ل ٢١

لاوازی (ضعیف)[٥] و دەست هەڵبەستراوەکان (الموضوع)[٦] وە هەروەها بنچینەیەکی بە تین و بنەمایەکی مەحکەمیان بۆ ئەو فەرموودانە دانا[٧] ...!!

---

[٥] فەرموودەی -لاواز- ئەو فەرموودانەن کە سیفاتەکانی فەرموودەی -ساغ- صحیح- وچاك - حسن- یان تێدا کۆنەبێ. ((علوم الحدیث)) لابن الصلاح ل٣٧ و ((تدریب الـراوي)) ١٧٩/١. ((الباعث الحثیث)) ل ٤٤.

[٦] فەرموودەی هەڵبەستراو: بریتییە لە هەواڵێکی دروست کراو بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ ((الباعث الحثیث)): ل ٨٠ -٨١. کە ناو دەبرێت بە (المردود)، (المتروك)، (الباطل)، (المفسد) کە گشتیان وەك (متروك)وان، هەروەها ناوی (ضعیف-لاواز)یشی بەسەردا ئەدرێت..!!
((التذکرة في علوم الحدیث: لابن الملقن)) ل١٨ تعلیق/ علي حسن علي عبدالحمید، ((تدریب الراوي)): ٩٨/١ ((علوم الحدیث: لابن الصلاح)) ل٣٧.
وە زانایان ئەو فەرموودەیان دابەش کردووە بۆ دوو جۆر:
یەکەم: ئەو فەرموودەیە کە درۆزنێك هەڵی بەستروە و داویەتیە پاڵ پێغەمبەرەوە ﷺ .
دووەم: فەرموودەیەکە درۆزنێك دەیگێرێتەوە لە کەسێکیتر، ئینجا بە ئانقەست و بوختان هەڵبەستەوە ئەیداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ. ((دراسة في مصطلح الحدیث)) ل ١٧٣.
وێنەی فەرموودە هەڵبەستراوەکان وەکو هەندێ لەو فەرموودانەی کە لە پێناوی سەرخستنی مەزهەبەکان دروست کراون وەك حەدیسی (سراج أُمتي أبو حنیفة) یان (یکون في أُمتي رجلٌ یُقال له محمد بن ادریس أضرّ علی أمتي من إبلیس، ویکون في أُمتي رجلٌ یُقال له أبو حنیفة هو سراج أُمتي) کەهەندێ لەدەمار گیرەکانی سەر بەمەزهەبی حەنەفی هەڵیان بەستوون. سەیری ((تنزیه الشریعة المرفوعة ...)) للحافظ ابن عراق (٣٠/٢) و((تذکرة الموضوعات (١١١) الذهبي)) =

- بکە.

وەحەدیسی (علي خير البشر، من شكّ فيه كَفَر ...) ئەمەش لە لایەن گومڕابووانی (الرافضـــة) کـان دروست کراوە. ((الموضوعات ١/٣٤٨)) (ابن الجوزي)، ((الفوائد المجموعة ٣٤٨ الشوكاني)، ((اللآلئ المصنوعة .. ١/١٧٠ السيوطي)).

ئەمەو چەندین حەدیسی دروستکراوی تر لە درۆ ونیفتیراکان، کە هۆکاردکـانی لەلایـەن زاناکـان باسکراوە: بۆ زیاتر شارەزابوون لەم حەدیسانە وهۆکارەکانی سەرهەڵندانی سەیری کتێبی ((الوضع في الحديث ١/٢١٦)) نوسراوی د. عمر فلاتة وکتێبی ((السنة ومكانتها في التشريع الإســـلامي)) (ل ٧٨،٨٨) د. مصطفى الســباعي بکـە زۆر بەسـوودە، وەهـەروەها بـۆ زانینـی ئـەو بنەمایانـەی کـە حەدیسە هەڵبەستراوەکانی پێ دەناسرێت سەیری کتێبە قایەکەی العلامة ابن القيم ((المنار المنيف في الصحيح والضعيف)) ل(٥٠-١٢٠) تحقيق الشيخ عبد الفتاح أبو غدة بکە.

[7] ناوبردنی (فەرموودەی هەڵبەستراو (الحديث الموضوع)بە فەرموودە (حدیـــث) لـەلایان زانایـان، مەبەست تەنها لە مانای زمانەوانییەکەیەتی، هەروەکو (الحافظ السخاوي) لەســەرەتای کتێبەکـەی ((المقاصد الحسنة)) ل٣ ئامـاژەی بـۆ کـردووە، و دەڵێـت، بەڵــگە لەسـەر نـاوبردنی ووتـە و درۆ هەڵبەستراوەکان بە (فـەرموودە) ئـەو فەرموودەیـە کـە ئیمـام (مسـلم) [ڕەحمەتیخوای لێبێ] لـە پێشەکی ((صحيح))ەکەیدا (ب١/ل٦٢) لە دوو هاوەڵـی بەڕێز (سمرة بن جندب) و (المغيرة بـن شعبة) ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (من حدث عني بحديث يرى أنه كذب، فهو .......) سەیر دەکەین پێغەمبــەری خـوا ﷺ ووتـە و درۆی درۆزنـانی ناو نـاوە بـە (فـەرموودە - حديث) سەیری ((المصنوع في معرفة الحديث الموضوع)) ل ١٣،١٤ بکە.

جا ئەوەی بە چاکی لەو بنـەماو بنچینـە - مەحکەمـە - تێگەیشـت و لێیـەوە بەهرەمەند بوو ئەوا دەتوانێت لە پلەی هەر فەرموودەیەك تێبگات و بیزانێت، ئەگەر چی ئەو فەرموودانەش هیـچ دەقێکیشـیان لـە سـەر نـەبێت...!! ئـا ئـەوە بنچینـەی فەرموودەناسی‌یە (علم أصول الحديث) یان زاراوەی فەرموودە (مصطلح الحديث)[8] ...!!پاشان هەندێك لە زانایانی دوایین (علماء المتأخرين) هەڵسان بـە دانـانی کتێبـی تایبـەت بۆ پشـکنین و خسـتنە ڕووی فـەرموودەکان و ڕوون کردنـەوەی بـارو دۆخەکانیان، کە بە ناوبانگترینی ئەو کتێبانە : (المقاصد الحسنة في بيان كثـير مـن الأحاديث المشتهرة، على الألسنة )یە هی (الحافظ السـخاوی)و هـەروەها هـەر لـەو

---

(٨)زانایان دەڵێن: بەبەڵگە گرتنی سوننەت پێویست بەدوو تێڕوانین دەکات.
تێڕوانینی یەکەم: لە جێگیری فەرموودەکانە لەلایەن پێغەمبەرﷺ چونکە مەرج نیە ئەوەی دراوەتە پاڵیەوە هەمووی ڕاست بێ..! تێڕوانینی دووهەم ئەوەیە ئایا دەقەکە چ حوکمێکی لێ وەردەگیرێ ئینجا لە پێناوی تێڕوانینی یەکەم پێویست بەدانانی یاسا و بنەمایەك کراوە. تا وەکو فەرموودە وەر گیراوەکان لە ڕەدکراوەکان جیا بکاتەوە لـە وانـەی دراوەتـە پـاڵ پێغەمبەر ﷺ کـە زانایـان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ئەو کردارەیان ناوناوە زاراوەی فەرموودە ((مصطلح الحديث)) سەیری ((مصطلح الحديث)) ل٦ بکە بە پێنووسی شێخ محمد صالح العثمـين. هـەروەها دەڵێـن: (علـم المصطلح)): زانستێکە چـەندین بنچینـە و بنەمایـەکی بـەخۆوە گرتـووە لـە بـارودۆخی، پاڵپشـت و دەقەکانی فـەرموودە و لـەڕووی وەرگـان و ڕەدکردنـەوەیان، دەکۆڵێتـەوە..!! سـەیری ((تیسـير مصطلح الحديث)) ل١٤ بکە نووسینی: محمود الطحان.

بارەوە کتێبی فەرموودە دەرکردن (التخـريجات) يـان دانا کە بارودۆخی ئـەو فەرموودانە ڕوون دەکەنەوە کە لە نێو کتێبەکاندا هـاتووە... لـەو فەرموودانـەی کە بێ بنچینەن (لا أصل له)[٩] وەك کتێبی (نصب الراية لأحاديث الهداية) هي (الحـافظ

---

[٩] مامۆستا عبدالفتاح ابو غدة: له پێشەکی کتێبی ((المصنوع في معرفـة الحديـث الموضـوع)) ل١٧، ٢٠، ٢١، ٢٢ نوسراوی (العلامة علي القارئ الهروي المكي).. دەڵێـت: کـاتێك زاناکـان لـە بارەی فەرموودەیەکەوە دەڵێن (لا أصل له)، یـان چـەندین دەربڕینـی تـری بـۆ دەردەبـڕن کـە بـە کورتی بەم شێوەی خوارەوەیە.

أ. هەندێ جار دەڵێن: ئەو فەرموودەیە: (لا أصل له) یان (لا يعرف له أصل) یـان (لم يوجد له أصل)، یان (لم يوجد) و چەندین دەربڕینی تر.. ئەوا ، مەبەستیان ئەوەیە، ئـەو فەرموودانـەی باسکراون (هیچ پاڵپشتێکیان نییـە تـا لێیانـەوە نـەقلیان کردبێ )..!! هـەروەها (الحـافظ الـسيوطي) [ڕەحمەتی خوای لێبێ ] له کتێبی ((تدريب الرواي)) له کۆتـایی جـۆری بیـست و دووهەمین: ب١/ل١٩٥ دەڵێت: کە دەڵێن ئەو فەرموودەیە (ليس له أصل) یان (لا أصل له) ئەو مانایە دەگەیەنێ کە (شيخ الاسلام – أبن تيمية) [ڕەحمەتی خوای لێبێ ]دەڵێت: مانای ئەو فەرموودەیە هیچ پاڵپشتێکی نییە (ليس له إسناد) واتە بگێڕەوەکانی دیار نین.

ب.وە هەندێ جار ئەو دەربڕینە (زاراوە)یـە لـەبارەی فەرموودەیـەك دەڵێـن: کـە پـاڵدراو وبـەرز کرابێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەڵام، لـێرەدا مەبەسـتیان ئەوەیـە کـە ئـەو فەرموودەیـە درۆ و هەڵبەستراوە خراوەتە پاڵ پێغەمبەرﷺ یان هاوەڵان، و شوێن کەوتووەکان بۆیە لـێرەدا وادەگەیـەنێ کـە ئـەو فەرموودەیـە

الزيلعي) هەروەها کتێبی (المغني عن حامل الأسفار في تخريج ما في الأحياء في الأخبار) هي (حـافظ العراقي)[10] و ((تلخيص الحبير في أحاديث الرافعي الكبير)) هی (حافظ ابن حجـر العسقلاني) هەروەها ((تخريج أحاديث الكشاف)) هی ناوبراو، و ((تخريج أحاديث الشفاء)) هـی شـێخی (سيوطی) کە هەموويان بە چاپ گەیشتون، وێرای ئەوەش ئەو پێشەوا بەڕێزانە خودا پاداشتی خێريان بداتەوە - ڕێگايان فرە ئاسـان

---

پاڵپشتێکی دیاری کراوی هەیە بەڵام لەو پاڵپشتیەدا (السند) درۆزن و دەستهەڵبەستراو هـەن، یـان بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا هەیە بـۆ بەدەرخسـتنی ئـەو بگێرەوە درۆزن و دەستهەلبەسـراوانەی کـە قسەی خۆیان، یان هی کەسانی تریان داوەتە پاڵیانەوە! بۆیە کـە ئـەو کاتـە دەڵێـن (لا أصـل لـه) مەبەستیان دیاری کردنی سەرچاوەی درۆکە و سەلماندنیەتی نەك لادان و لەبەرچاو نەگرتنی بوونـی پاڵپشتەکە!.بۆ زیاتر حاڵی بوون لەم زاراوانەی باس کران سەیری کتێبی ((قواعـد التحديـث)) ل١٢٦ نووسینی جمال الدين القاسمي.

[10] لەو کتێبەدا هەڵساوە بەدەر کردن و دیاری کردنی پلـەی فـەرموودەکانی نێـو کتێبـی (أحيـاء علوم الدين)ی غەزالی، کە لە ژێدەر (هامشـی) کتێبەکـەو لـە کتێبـی سـەربەخۆش چـاپ کـراوە، وەشێخ (تاج الدين السبكي) لە کتێبی (طبقات الشافعية الكبرى) (ب٤/ل١٠١-١٨٢) و لەبـاسـی ژیـان نامـەی غـەزالیدا نزیکـەی هـەزار (١٠٠٠) فـەرموودەی دەسـت نیشـان کـردوە لـە نێـو کتێبەکەیدا لەوانەی کە هیـچ بنچینەیەکیان نیـیە لەلای فەرموودەناسان بە پێچەوانەی ئەوانـەی وا گومان ئەبەن کەوا ئەو کتێبەی غەزالی تەنانەت خاڵیە لە فەرموودەی لاوازیـش ئـەوەکو فـەرموودە هەلبەسـراو و بێبنەڕەتەکان!!!

کردووە بۆ زانیەن و زانست خوازان (طالب العلم)ی دوای خۆیان تاوەکو زۆر بە سانایی پلەی گشت فەرموودەیەك بزانن، بە ڕێگای ئەو کتێبانە و چەندین کتێبی تریش کە لەو بارەوەن...!![*] بەڵام بە داخێکی گرانەوە، ئەبینین خەڵکانێك هەن لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بە دوورن و چاوی پێداناخشێنن...!! بۆیە بەم هۆیەوە دووچاری نەفامی و سەرگەردانی دێن و لە بارەی ئەو فەرموودانەی کە لە مامۆستاکانیان بیستویانەو، لەبەریان کردوون، یان لە هەندێك لەو کتێبانەی خوێندویتیانەوە ، کە دوورن و بگرە هەر فەرموودە - تەواو - (صحیح)کانی تێدا بە چەنگ ناکەون ..!!

تەنانەت کە گوێ دەگرین لە ووتار و ئامۆژگاری هەندێك لەو مامۆستاو ڕێپیشاندەر و یان ووتار خوێنەرانی هەینی!! حەتمەن لەو فەرموودە لاوازو دەست هەڵبستراوانەی لێیەوە بەدی دەکرێت، ئەوەش کارێکی خەتەرناکەو جێگای ترسانە، کە بەو هۆیەوە دووچاری هەڕەشەی توندو تیژی پێغەمبەری خوا ﷺ ببنەوە، وە ئەم کارەیان سەر بکێشێت بۆ سزای سەختی نێو دۆزەخ...

---

(*)وەك کتێبی (اللؤلؤ المرصوع فیما قیل لا اصل لـه او باصله موضـوع) دانراوی (ابی المحاسن القاوقجي)یەوە هەروەها (نزهة المجالس ومنتخب النفـائس) دانراوی (صفـوري) ئەو فەرموودە هەڵبەستراوو چیرۆك و سەرگوزشتەنەهان لێدا کۆکردۆتـەوە کە هیچ بنچینەیەکیان نییە لەلای فەرموودەناسانەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار [متفق عليه]. فەرموودەیەكی (صحیح)ەو (متواتر)یشە[11]، واتە: هەركەسێ بە ئەنقەست بەدەم منەوە درۆ بكات با ئەو كەسە شوێنی خۆی لە ناو ئاگری دۆزەخ ساز بدات...!! بۆیە ئەگەر چی بە ئانقەست و بێ دەستی خۆشیان، و بە راستەوخۆ درۆكە بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ ناكەن، ئەوا - بێ گومان - بە هۆی لە یەكتر هەڵگرتنەوە و گێرانەوەیان لە یەكتری درۆكە هەڵدەبەستن...!! یان لە ئاكامی گێرانەوەی ئەو فەرموودانە دەبێ كە بیستوویانەو ئاشنایی بوون - دەشزانن - ئەو فەرموودانە لاوازن یان درۆو دەست هەڵبەستراون[12] ...!!

---

[11] زانایان دەڵێن ئەو فەرموودەیە زیاتر لە شەست (٦٠) كەس لە هاوەڵانی بەرێز ڕیوایەتیان كردووە، لەوانە دە(١٠) موژدەپێدراوەكانی بەهەشتان! لەوانیشەوە كۆمەڵێكی زۆر ڕیوایەتیان كردووە.... سەیری (مصطلح الحدیث) ل٨ بكە.

[12] هەروەكو زۆر لە ووتار خوێنەران و مەلاكانی ئەو سەردەمە ئەو درەمەیان گرتووە وە كاتێكیش لەو كارە ترسناكە ئاگەدار دەكرێنەوە، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێن: بەڵێ ئێمە پێی ئاگەدارین بەڵام بۆ بەرژەوەندی گشتی و لە پێناو ئاشنا كردنی خەڵكی بە ئاینەكەمان لەو ئاستەدا چاو پۆشی لێ دەكەین! بەڵام ئەوانە هەمان هەڵوێستی نەفامانی پێشینیان هەیە كاتێك دەیانووت: (ئێمە درۆ بە دەم پێغەمبەروە ناكەین، بەڵكو درۆ بۆ ئەو دەكەین)..!! ئەو كارە ئەوپەڕی نەفامی وكەمژیری و ئەوپەڕی تاوان دەگەیەنێ..!! ئەگینا پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە خۆی بۆ كامڵ كردنی (شریعە)كەی ئاتاج بەكەس نەبوومو نابێ..!! سەیری (الباعث =

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریشمانﷺ بە ڕاشکاوی ئاماژەی بۆ ئەو ڕاستی یە کردووە، کە دەفەرمووێ : (كفى بالمرء كذباً أن يحدث بكل ما سمع) [رواه مسلم (ب/ل١٠) عن أبي هريرة [رضي الله عنه] .

واتە : ئەوەندە درۆیە بەسە بۆ مرۆڤێك هەرچی گوێ لێ دەبێت و دەیگێڕێتەوە...!!

هەروەها ئیمام موسلیم - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - بۆمان دەگێڕێتەوە لە (صحیح)ەکەیدا (ب١/ل٨) کە ابن (وهب) دەڵێت: ئیمام مالیك پێی ووتم:- ((إعلم أنه ليس يسلم رجل حدث بكل ما سمع ، ولا يكون إماماً أبداً وهو يحدث بكل ما سمع)). واتە: بزانە ئەو کەسە لە بە هەڵەداچوون و چەپڵەکی سەلامەت نابێ، کە هەر قسەیەك ببیسێ و بیگێڕێتەوە ، و نابێ بە ئیمام و پێشەوا ئەو کەسەی گوێ بیستی قسەیەك دەبێ و دەیگێڕێتەوە[١٣] ...!! ((صحيح مسلم)) - بشرح النووي: ب١/ل٦٢.

---

= الحيث) ل٧٩ بکە.

[١٣] هەر لە (صحیح)ەکەیدا (ب١/ل٨) (١) باب: وجوب الرواية عن الثقات وترك الكذابين والتحذير من الكذب على رسول الله ﷺ: دەڵێت بزانە خودا سەرتبخا: پێویستە لەسەر هەر تاکێکمان جیاوزای لە نێوان فەرموودە ساغ و ناساغەکان و لە نێوان ڕاویە متمانە پێکراوو گومان لێ کراوەکان بکات نابێ هیچ شتێکیان لێیەوە بگێڕێتەوە، تەنها ئەو کاتەی لە تەواوی فەرموودەکە دڵنیا بیت، وپێویستە خۆت بە دوور بگری لە ڕاویە گومان لێ کراو وتاوانبارەکان.

هەروەها ئیمام (ابن حبان) رەحمەتی خوای لێ بێ لە (صحیح)ەکەیدا ل ٢٧ دەڵێت: ((فصل: باسی چوونە ناو ئاگر لەوانەی کە شتێکیان (ووتەیەکیان) خستۆتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ و لە بارەی ساغی و تەواوی(صحة)ەکەیدا شارەزانین) ئەو فەرموودەیەی هێناوەتەوە کە أبو هريرة [رضي الله عنه] بۆمانی ڕیوایەت کردووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە دەفەرمووێ: (من قال على ما لم أقول فليتبوأ مقعده في النار ) واتە:هەر کەسێ شتێك بڵێ و بیداتە پاڵمنەوە، منیش نەم ووتبێ، ئەوا، با ئەو کەسە جێگای خۆی لەناو ئاگری دۆزەخ ئامادە بکات. پاشان دەڵێت:((باسی: هەواڵێك کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی ئاماژەمان بۆ کردووە لە ڕابردوو، پاشان

---

لەوانەی لە تاقم و ئەهلی بیدعەن، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ووتمان ئەو فەرموودەیەی خودای مەزنە: {يأيها الذين آمنوا ان جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا أن تصيبوا قوماً بجهالةٍ فتصبحوا على ما فعلتم نادمين} [الحجرات:٦. هەروەها کە دەفەرمووێ {ممن ترضون من الشهداء} [البقرة:٢٨٢، هەروەها {وأشهدوا ذوي عدل منكم} [الطلاق:]٢. جا ئەوەی لەو ئایەتاندا دەفامرێنەوە ئەوە دەگەیەنن، کە هەواڵی فاسق و تاوانباران و ئەوانەی متمانەیان پێ نەکراوە، کاریان پێ ناکرێت و ڕەت دەکرێنەوە...!!

دوای ئەوەی کە بەردەوام ئەبێت لەسەر باسی سزای ئەوانەی درۆ ئەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا ئەو فەرموودەیە دەهێنێتەوە - عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ انه قال: " سيكون في آخر امتي أُناسٌ يحدّثونكم بما لم تسمعوا انتم ولا آبائكم، فإياكم وإياهم لا يضلونكم ولا يفتنونكم".

لە سیاقی سەنەدەکەیدا بەردەوام دەبێت و ئینجا ئەو فەرموودەیەی (سمرة بن جندب) [رضي الله عنه] دەهێنێتەوەکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆمانی ڕیوایەت کردووە دەفەرموێ:(من حدث عني بحديث يرى أنه كذب فهو ...) واتە: هەرکەسێك فەرموودەیەك لەمنەوە بگێڕێتەوە و-باسی بکات-و ئاگادار بوو بەوەی کە فەرموودەکە درۆو هەڵبەستراوە، ئەوا خۆیشی یەکێکە لەو درۆزنانە..پاشان دەڵێت:((باسی هەواڵی دووەم، کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوی بۆی چووین..))ئینجا فەرموودەکەی (أبو هريرە [رضي الله عنه] واتە: فەرموودەی یەکەم دەهێنێتەوە..!!

## سەرنجێك[*]

**خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویست** :

ئەوەی ئێمە هێناومانەتەوە و باسمان کردووە-ئەوەمان بۆ ڕوون و ئاوەڵانەکاتەوە کە: نابێت و ڕەوا نییە بە هیچ جۆرێ، بڵاو کردنەوەو گێڕانەوەی فەرموودەکان- (لەلای موسڵمانانەوە، بێ ئەوی لە ڕاستی و تەواوی فەرموودەکە دڵنیا و دامەزراو نەبین[14]..!!

---

[*] ئەم دەستەواژە (عبارة)یە خۆم زیادم کردووە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی بابەتەکە .

[14] بەڵکو دەبێت (تەنها ئەو فەرموودانە وەربگرین و کاری پێبکەین کە پاڵپشتێکی تەواویان هەیە، بەپێی ئەو بنەماو بنچینە زانستیانەی کە زانایانی فەرموودە بۆ ئەو مەبەستە دایناوە..!! سەیر (القضايا الكلية للاعتقاد في الكتاب والسنة)ل11 بکە نووسینی عبدالرحمن عبدالخالق.

..لاد ..ەوەی پێی نایە ناو ئەو کارە ترسناکە، ئەوا ئەوەندە بەسیەتی ئەگەڵ ..ەو..ەی درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ نەکەن حسیبی بۆ بکریت هەروەکو پێغەمبەری سەروەر وئازیزمانﷺ دەفەرموێ:(إن كذباً علي ليس ككذب على أحد، فمن كذب علي متعمداً فليتبوأ مقعده من النار) [رواه مسلم].

واتە: درۆ کردن بەدەم منەوە، هەرگیز، وەکو درۆ کردن بەدەم یەکێکی ترەوە نییە، ئەوەی درۆ بداتە پاڵ منەوە ئەوا با جێگای خۆی لە نێو ئاگر ساز بکات..!!

---

واتە: دەبێت لە جۆری فەرموودە وەرگیراوەکان (مقبول) بێ وفەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو نەبن بەڵام سەبارەت بە کارکردن بە فەرموودەی لاواز لە لایەن زانایانەوە مشت= =ومڕێکی زۆری لەسەرە شێخی (الالباني) دەڵێت: ئەگەر چی هەندێ کەس هەمن ئەو کارەیان نسال کردوتەوە ڕایان وایە کە فەرموودەی لاواز لە بواری (فضائل الأعمال)ەوە کاری پێ دەکرێت، بەڵام ئەو ڕایە بەلای منەوە گرنگی پێ نادرێت، هەر وەکو سوپاس بۆ خودا لە لای گەورە پیاوان و پێشەوایان هیچ یەکێکیان بڕوایان وانییە کە فەرموودەی لاواز لە ئەحکامی شەرعی داکاری پێ بکرێت، بەڵکو لەسەر ئەو ڕایە کۆن، کە پێویستە ئەو فەرموودانەی کار پێ دەکرێن لە بەشی وەرگیراوەکان بن (مقبول) کە بەلایەنی کەمەوە دەبێ (حسن لغيره)بێ.. پێشەکی کتێبی((غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال والحرام)).

تێبینی/ تەواوی ئەو باسە لە پاشکۆی ئەو نامیلکەیەدا کۆکراوەتەوە لە ژێر ناوی (حوکمی فەرموودە لاوازەکان).

## مەبەست لە نووسینی*

## (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة)

## ((زنجیرەی فەرموودە لاواز وهەڵبەستراوەکان))

لەبەر گرنگی و خەتەرناکی ئەو کارە واتە:(بڵاوکردنەوە و گێڕانەوەی فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەکان لە نێو موسڵمانانەوە)... وام ڕەچاو کرد کە منیش بەشداری بکەم لە کاروانی پیرۆزی (نزیك کردنەوەی ڕێگای چاو پێداخشاندن و شارەزابوون و ئاگادار بوون لەو فەرموودانەی کە هیچ بنچینەیەکیان نییە لەلایەن فەرموودەناسان-المحدثين- ویان بنچینەی هەڵبەستراو (موضوع) یان هەیە..!! بەڵکو ببێتە مایەی ئاگادار کردنەوەو وەبیرخستنەوەی ئەوانەی بیر دەکەنەوەو- لە ئاکامی ئەنجامدانی تاوانەکان- دەترسن..!!

دیمەشق

مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٧٤ کۆچی

محمد ناصر الدين الالباني

---

* ئەو دەستەواژەیە، بۆ خۆم زیادم کردووە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی بابەتەکە.

# پاشكۆ

((تحقيقاً مني للنصح لإخواني المسلمين، صنفت، ولا أزال أصنف من الكتب ما به يستعين القراء على تمييز الصحيح من الضعيف، والطيب من الخبيث مما يدور على ألسنة الناس، أو سجل في بطون الكتب من الحديث)).

**محمد ناصرالدين الألباني**

# حوكمی فەرمووده لاوازەكان

هەر وەكو ڕون و ئاشكرایە جۆرەكانی تری فەرمووده واته (صحیح وحسن) و ئەوانەی دەچنه پاڵیانەوه و هاومەرجن، گشتیان وەردەگیرێن و كار پێ دەكرێن، بەڵام سەبارەت به فەرموودەی لاواز -ضعیف- له سێ ڕاوبۆچوونی لـه یـەك جیادا خۆی نواندووه له لایەن زانایانەوه...

ڕای یەكەم: كۆمەڵێك له زانایان ڕایان وایه كه فەرموودەی لاواز بـه هیـچ جۆرێ كاری پێ ناكرێت، جا له ئەحكامی شەرعی، یان بۆ هەڵنان و ترساندن (الترغیب والترهیب) وكاری چاكه بێ (فضائل الأعمال) ((ئەوا لـه هیـچ لەوانـه كـاری پێ ناكرێت، ئەو زانایانەی كه لەسەر ئەو ڕایه یەك دەنگن: یحیى بن معین(١)، وأبي بكر بن العربي له مالیكیەكان(٢) و هەروەها له شافعیەكان أبو شامة المقدسي، و له ظاهریەكانیش أبن حزم (٣)، و هەروەها ئیمام (البخاري) وئیمام (مسلم)یش هەمان ڕایان هەبووه، ئیمام (الشوكانی)(٤) وشێخی فەرموودەناس (الألباني) یش لەسەر ئەم ڕایه كۆن و پێی ڕازی بوون...!! و هۆی پشتگوێ خستنی فەرموودەی لاواز له لای ئەو كۆمەڵه زانایه ئەوەیه كه دەڵێن: (تاكه سەرچاوەی هەڵهێنجانی

---

هەروەكو له كتیبی (الملل والنحل) دەڵێت (( مانقله اهل الشرق والغرب ،او كافة عن كافة ،اوثقة عن ثقة ،حتى یبلغ الى النبي(ﷺ) الا إن في الطریق رجلاً مجروحا بكذب أو غفلة · او مجهول الحال ،فهذا یقول به بعض المسلمین ولا یحل عندنا القول به ولا تصدیقه ولا الاخذ بشيء منه)).

لاواز له لای ئەو کۆمەڵە زانایە ئەوەیە کـە دەڵێـن: (تاکـە سـەرچاوەی هەڵـهێـنجانی ئایین- قورئانی پیرۆز و سونەتی پاکی پێغەمبەرە ﷺ بەڵام فەرمودەی لاواز خۆ لەو فەرموودانە نی‌یە دڵنیایی بدات بەوەی کە لە لای پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ!! کەوا بوو کارکردن بەو فەرموودەیە خواستنی ئایینە جگە لە سەرچاوەی خۆی..!!

ڕای دووهەم: کۆمەڵێکی تر لە زانایان ڕایان وایە کە ئـەو فەرموودەیـە لـە هـەموو بابەتێکدا درووستە کاری پێ بکرێت، گەر هاتوو جگە لـەو فـەرموودە لاوازە هـیـچ دەقێکی قورئانی پیرۆز و سونەتی لەسەر نەهاتبوو، ئەوانـەی لەسـەر ئـەو ڕایـە کـۆن ئیمام (أحمد بن حنبل- وأبي داود- وابن المبارك) کـە بـە لایانـەوە فـەرموودەی لاواز چاکتر بووە لە ڕاوبۆچوونی کەسانێری بێ بەڵگە..!! هەر وەکو ئیمام أحمد دەڵێـت: (ضعيف الحديث عندنا أحب مـــن رأي الرجـــال)هـەروەکو (ضعيـف)یشـی پێـش (قياس)یان خستووە (٥) جا ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بـۆ بکـەین: ((ئیـمـام ئەحمەد مەبەستی ئەو فەرموودە لاوازانە نەبووە کە مەرجەکانی فەرمودەی (صحيـح و حسـن)یان تێدا کۆ نی‌یە! وەك (منكر والمضطرب* الشاذ** المـتروك***) و ئـەوانی‌تر، بەڵکو مەبەستی لەوەدا لاواز (ضعيف)ی نزیك لە فەرموودەی صحيح بووە،

---

* المضطرب: ئەو فەرموودەیە کە لە لای ڕاویەك یان چەند ڕاویەیـەك هـەر جـارەی بـە جۆرێـك ریوایەت کرا بێ و لە ڕووی هـێزی هـەر یەکـیان نـاتوانرێت لـەوی‌تر بـە چاکتر یـان بـەهێزتر برانرێت، ئەو دژواریەش بە هۆی نەبوونی زەبتی ڕاویەکانەوە دەبێت. ئـەم حاڵەتـەش لەسـەند و ـ

چونكه ئەو سەردەمەدا فەرموودە دابەش نەكرابوو بۆ (التقسيم الثلاثي) واتە (صحيح، حسن، ضعيف)، بەڵكو تەنها (التقسيم الثناني) واتە: (صحيح، ضعيف) لە ئارادا بوو، بەلاّم ئەو كاتە لە ناو (ضعيف)يشدا دوو جۆر هەبووە.

١- الضعيف الأعلى: لاوازى بەرز يان (ضعيفٌ ليس بمتروك).

٢-الضعيف الأدنى: لاوازى نزم يان (ضعيفٌ متروك)

كە هى يەكەم لاوازێكە درووستە كارى پىێ بكرێت و هى دووهەميش لاوازێكە پێويستە وازى لێ بهێنرێت..!!

ئينجا لەو سەردەم دا ئيمام ئەحمەد و -ابن المبارك- (ضعيف)ە بەرزەكەيان مەبەست بووە! كە بە فەرموودەى (حسن) دەژمێردرێت بە پێى (تقسيم الثلاثي) كە لە لايەن (أبو عيسى الترمذي)ىيەوە[ رەحمەتى خواى لێ بێ] داهێنراوە..!!))(٦)

---

- مەتنى فەرموودە ڕوودەدات. ((التعليقات الأثرية/ ل ٦٠،٦١)).

** الشاذ: ئەو فەرموودەيەيە كە تەنها متمانە پێكراوێك ڕيوايەتى كردووە بە پێچەوانەى ئەو ڕاويانەى كە لەو متمانە پێكراوترن- ئەم حاڵەتەش لە سوند و مەتنى فەرموودەدا ڕوودەدات.((التذكرة في علوم الحديث/ ل١٦)).

*** المتروك: : بريتييە لەو فەرموودەيەى كە تەنها لە كەسێكى لاواز (ضعيف) ڕيوايەت كرا بێ و تەنها لەويشەوە گێرابێتيانەوە، و هۆى لاوازييەكەى ئەوەيە كە يان باباپەكى درۆزن بووە يانيش زۆر هەڵەى كردووە و زۆريش بێ ئاگا بووە.((التعليقات الأثرية/ ل٧٢)).

ئەبەر ئەوە فەرموودەی (ضعيف) لە ((جامع الترمذي))دا ئەو (ضعيف)ە نییە کە لە ((مسند))ی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە (٧).ڕای سێهەم: خاوەنی ئەم ڕایە پێیان وایە: فەرموودەی لاواز تەنها لە بارەی (فضائل الأعمـــال) و (الـــترغيب والـــترهيب) و (المواعظ) و (الرقائق) و (قصص)و (الزهــــد) و (مكـــارم الاخـــلاق) دا کـاری پـێ دەکرێت، بەڵام لە بواری عەقیدەو (ئەحکامی شـەرعی)یـەوە وەك ئـەوەی لـە باسـی (حلال و حرام) و (احکام)ەکانەوە بدوێت، ئەوا کار پێ کردنی دروست نییە.

[(ابن عبدالبر) و (ابا زكريا العنبري)و (عبدالرحمن بن مهدي) و(والامام النـــووي)] (٨) لە سەر ئەو ڕایە کۆن هەر وەکو (ابن مهدي) دەڵێــت: ((کـاتێك فەرموودەیـەکمان ڕیوایەت دەکرد ئەگەر لە بارەی (حلال وحرام) بوایە ئەوا لـە ئاسـت سـەنەدەکەیدا توند وتیژ ئەبووین وهێرشی ڕەخنەگریمان لەسەر پیـاوانی نێـو سـەنەدەکە بـە گوڕتـر ئەکرد ،بەڵام ئەگەر لەبارەی (الفضائل) و(الثواب) و(العقاب) بوایە ئـەوا ئـەو پـەڕی هەڵوێستی سانا و نەرم ڕەویمان دەنواند..!!)) (٩).

## تێبینی:—

بەڵام ئەم ئاسانکردنەوە بێ سنوورە وای کرد ئایینەکەمان ڕووە وجـەندیـن کـاری داهێـنراو وعیبادەتی بێ بنەڕەت بکاتەوە کەلـەم فـەرموودە لاوازانـەوە سـەری هەڵداوە. وەکـو ئـەو بیدعـە ئاشـکرایەی کـەناویان ناوە (تلقـین الميـــت) واتـە تـەلقینی دوای مـردن کـە لەفەرموودەیەکی (لاوز ـ ضعيف) دا وەریان گرتووە بە بیانووی (فضائل الأعمـــال)ەوە

**تێکەڵی ناو یاساکانی جەنازەیان کردووە، کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە :** (إذا مات الرجل منكم فدفنتموه فليقم أحدكم عند رأسه، فليقل: يافلان ابن فلانة! فإنه سيسمع، فليقل: يافلان ابن فلانة! فإنه يستوي قاعداً، فليقل: يافلان

ابن فلانة! فإنه سيقول أرشدني أرشدني رحمك الله، فليقل: أذكر ما خرجت عليه من دار الدنيا: شهادة ان لاإله إلاّ الله وحده لاشريك له، وأن محمداً عبده ورسوله، وأن الساعة آتيةٌ لاريب فيها وأن الله يبعث من في القبور، فإن منكراً ونكيراً يأخذ كل واحدٍ منهما بيد صاحبه ويقول له: ما تصنع عند رجلٍ قد لقن حجته؟ فيكون الله حجيجهما دونه).

**تەخریجی فەرموودەکە:**

أخرجه القاضي الخلعي في ((الفوائد)) (٢/٥٥) عن أبي أُمامة الباهلي. فيه عتبة بن السكن قال الدارقطني: (متروك الحديث) وقال البيهقي (واه منسوب الى الوضع). والحديث أورده الهيثمي (٤٥/٣) عن سعيد بن عبد الله الأزدي قال: شهدت أبا أُمامة ... فذكر الحديث، وقال: رواه الطبراني في معجمه ((الكبير)) وفي إسناده جماعة لم أعرفهم.

**قال الألباني:**

قلت، فأختلف في اسم الراوي عن أبي أُمامة ففي رواية الخلعي أنه جابر بن سعيد الأزدي وفي رواية الطبراني أنه سعيد بن عبدالله الأزدي، وهذا أورده ابن ابي حاتم (٧٦/١/٢) فقال: ((سعيد الأزدي)) لم ينسبه لأبيه، و لم يذكر فيه جرحاً ولا تعديلاً، فهو في عداد المجهولين .....

وقال النووي في ((المجموع)) (٣٠٤/٥) بعد أن عزاه للطبراني: ((وإسناده ضعيف وقال ابن الصلاح: ليس إسناده بالقائم)). وكذلك ضعفه الحافظ العراقي في ((تخريج الإحيلء)) (٤٢٠/٤) وقال ابن القيم: في ((الزاد)) (٢٠٦/١): (لا يصح رفعه) ...

**ئينجا لەكۆتايى ((تخريج)) كردنەكەى ئەڵێت:** وجملة القول أن الحديث (منكر) عندي إن لم يكن موضوعا. وقد قال (الصنعاني) في ((سبل السلام)) (١٦١/٢) : ((ويتحصل من كلام أئمة التحقيق أنه حديث ضعيف، والعمل به بدعة، ولا يغتر بكثرة من يفعله)).

**واتە: كۆى قسەكان ئەوەيە ئەو فەرموودەيە بەلاى منەوە (منكر) ە ئەگەر هاتوو هەڵبەستراويش نەبێت !! (الصنعاني )يش لە كتێبەكەى ((سبل السلام)) (١٦١/٢) دەڵێت: لەووتەى پێشەوايانى لێكۆڵەرەوەى زانستى دەردەكەوێت كە فەرموودەيەكى زەعيفە، وكارپێكردنيشى بيدعەيە. وەئەوەش فريوتان نەدات كە كاتێ لەلاى خەڵكىيەوە بەشێوەيەكى بەر بلاوو ئەنجام ئەدرێت.**

سەیری ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) (٥٩٩/٢ ـــ ص ٦٥،٦٤) بکە.

منیش ئەڵێم: مامۆستا (محمد عيد العباسي) لە کتێبەکەی (بدعة التعصب المذهبي - ص١٥٣) لەژێر باسی (أمثلة من الأحاديث الواهية المحتج بها في الكتب المذهبية) دەڵێت: دوای ئەوەی کە(النووي) لە کتێبی (المجموع) دا (٣٠٤/٥) ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە بە (ضعيف) یشی داناوە ئینجا ئەڵێت: کاری پێ ئەکرێت چونکە لەبارەی (فضائل الأعمال) ەوەیە!! بەڵام ئەم بنەڕەت وڕێسایەی کە لای ئەم کۆمەڵە وزانایانی دوایین بە شێوەیەکی هەرەمەکی بڵاو بۆتەوە کارێکی هەڵە ودوور لەڕاستی‌یە. درێژەی ئەم باسە لە پێشەکی کتێبی (تمام المنة في التعليق على فقه السنة) دایە لە بنەڕەتی (١٢ تا ١٥٠) و هەروەکو ئەم فەرموودەیەش لەبارەی ئەحکامی شەرعی‌یەوەیە نەوەکو لەبارەی (الفضائل).

هەر لە هاوڕای کۆمەڵی سێهەم هەندێکی تر لە زانایان ئەو کارەیان فرە ئاسان کردۆتەوە لە ئاست کارکردن بە فەرموودەی لاواز لە بواری (الترغيب و الترهيب)ەوە بەڵام سێ مەرجیان بۆ داناوە. (١٠).

١- نابێ فەرموودە ریوایەت کراوەکەلاوازیەکەی زۆر بەهێز بێ، چونکە ئەو فەرموودانەی کەتەنها لەلایەن درۆزن و بەدکرادرێکەوە بۆمان هاتبێ ئەوا بەهیچ جۆری دروست نییە کاری پێ بکرێت ..! وەك (معلل* و منکر** ) وئەوانی تر.

٢- ئەو فەرموودانەی کە لەبارەی (الترغیب والترهیب)ەوەن، دەبێ لە بنچینەیەکی جێگیرەوە سەر هەلبدات ولەژێر بۆ چوون ویاسای گشتی ئیسلام دا جێگای ببێتەوە، نابێ لەئاست دەقەکانی تری (قورئان وسوننەت) نامۆ و(غریب) بێت ونەسازی تێدا بەدی بکرێت ..!!

٣- نابێ گومانی ئەوە ببات کەوا ئەو فەرموودە لاوازە پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی بەلکو دەبێت تەنها لەسەر گومان بوەستێ ..!! واتە بە (صیغة التمریض)بیڵێ وەکو (روی عنه). (اورد عنه). (جاء عنه). (نقل عنه) ....، نەوەکو بە

---

* معلل: ئەو فەرموودەیە کە لە سەنەد یان مەتنەکەیدا دەرودو عیلەتێکی تێدایە ونەساغ بووە، بەلام رواڵەت ودیوی بەرچاوی فەرموودەکە بەسەلامەتی لەم دەردانە خۆی پیشان ئەدات. سەیری ((ألفیة السیوطي ص ١١)) و ((الباعث الحثیث ص ٦٥)) و ((التعلیقات الأثریة علی المنظومة البیقونیة ص ٥٧)) علي حسن عبد الحمید الأثري بکە.

** منکر: ئەو فەرموودەیە کە یەکێکی (ضعیف) لوراویەکان بەپێچەوانەی ریوایەتی متمانە پێکراوەکان (الثقات) ریوایەتی بکات. سەیری ((النکت علی ابن الصلاح ــ ٢/٤٥٩))، و((شرح ألفیة السیوطي ــ ص٩٣))، و ((فتح المغیث ــ ١/١٩٠)) و((توضیح الأفکار ــ ٢/٥))، و((التعلیقات الأثریة .. ــ ص ٧٠)) بکە.

(صيغة الجزم) وەكو ئەوەی كە بلێت (قال رسول الله ﷺ)، یان (فعل)، (امر)، (نهی)، (حكم) ... هتد(١١)

## ڕای پەسەند كراو

زانایانی شارەزا گوتویانە، ڕای یەكەم: واتە بەیەكجاری پشتگوێ خشتنی فەرموودە لاوازەكان ڕای پەسەندە، چونكە ڕەچاو كردنی ئەو ڕایە مایەی پاراستن وپاك ڕاگرتنی ئایینەكەمانە لەهەموو لەكەداری وشێواندنێك كە بەناوی ئایینەوە سەر هەڵدەدەن ! هەر وەكو لەئاكامی ئاسان كردنەوەی ڕێگای كاركردن بەفەرموودەی لاواز لە بواری (فضائل الأعمال) ەوە، وەدەرگا خستنە سەر پشت وفراوان كردنی ئەو كارە، ژمارەیەكی زۆر لەفەرموودە بەدو نارێكەكان تێكەڵ بەفەرموودە ساغەكان بوون ولەسنووری یاسای دارێژراوی زانایانی فەرموودە دەرچوون (١٢)، تەنانەت بەو هۆیەوە چەندین عیبادەتیش (١٣) سەری هەڵداوە كە بێ بنچینەن ولە ئیسلامدا سەریان نەگرتووە !!

وێـڕای ئـەوەش پێشـەوا وزانـا شـارەزاكان دەڵـێـن، فـەرموودە لاوازەكـان، هیـچ دڵنیـایـیـەك نادەن كە لای پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمـان هـاتبێ، لەبـەر ئـەوە نـابێ بـەهیـچ جۆرێ ئەو فەرموودانە كار پێ بكرێن وبەبەڵگە بگیرێن..!!(١٤)

هەر وەكو (أبو شامة المقدسي) [ڕەحمەتی خوای لێ بێ] سەبارەت بە كـار پـێ كردنی فەرموودەی لاواز لەبواری (فضائل الأعمال) ەوە دەڵێت:(١٥)

ئەو كارە لەلای توێژینـەرەوانی زانستی وئـەهلی حـەدیس وئوصـولی وفەقیهـەكانیش هەڵەیە بەڵكو دەبێت ئـەو كەسـە ڕوونـی بكاتـەوە وبـاس بكـات كـە فەرموودەكـە لاوازە ئەگینا دەچێتە گەر ئەوانەی

كە بە ئاگری دۆزەخ ترسێنروان لەو فەرموودەیەدا : (من حدث عني بحديث يرى أنـه كذب فهو أحد الكاذبين) (١٦). شێخی فەرموودەناسی (محمد ناصر الدين الألبـــاني) دەڵێت (١٧): ئەو حوكمە دەربارەی كەسێكە كە تەنها بێدەنگی كردووە لـە ئاسـت فەرموودە لاوازەكان لە ڕووی (فضائل)، باشە ئەگەر لە ڕووی (أحكام) وشتی تر بێ دەبێ چ حوكمێكی بۆ هەبێ ...!!

پاشان دەڵێت: ئەو كەسەی پێی نایە ناو ئەو كارە، ئەوا یەكێ لەو دووكەسەیە :

١- یـان كەسـێكە لـەبارەی لاوازیی فەرموودەكـە ئاگـادارە، خەڵـكی لێ ئاگـادار ناكاتەوە، ئەوا بێ گومان غەشی كردووە بەرامبەر بە مسوڵمانان وئەو كەسە دەچێتـە ڕیزی ئەوانەی كە لە نێو فەرموودەكەدا باسكراون.

ئیمام (ابن حبان) ڕەحمەتی خوای لێ بێ! دەڵێت: (١٨) لەو فەرموودەیەدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کە یەکێ فەرموودەیەکی ناتەواو بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، وخۆیشی پێی ئاگادارە ئەوا ئەو کەسە یەکێ لە درۆزنەکان حسێبی بۆ دەکرێت ..!! چونکە فەرموودەکە لە ڕواڵەتەوە زۆر بەتوندتر حوکمی لەسەر داوە! کە دەفەرمووێ (من روى عني حديثاً وهو يرى أنه كــذب ...) واتە: ئەوەی فەرموودەیەك لەمنەوە بگێڕێتەوە و(گومانی وابێ) کەئەو فەرموودەیە درۆ هەڵبەستراوە ! .. سەیر دەکەین لەیفەرمووە یەقین ودڵنیایی هەبێ! بۆیە هەر شتێك لەسەر گومان ودوودڵی وەستابێ جاڕاست بێ یا ناڕاست ئەوا دەچێتە نێو چوار چێوەی حوکمی ڕواڵەتی فەرموودەکە ..!!.

٢- یان کەسێکە لەبارەی لاوازی فەرموودە نازانێ ئەو کەسەش بەهەمان شێوە تاوانبارە، چونکە ووتەیەکی داوەتە پاڵ پێغەمبەری خواوە ﷺ وزانیاری پێ نەبووە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێ (إياكم وكثرة الحديث عني، من قال عليّ فلا يقولن إلاّ حقاً أو صدقاً، فمن قال عني ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار) (١٩).

یا دەفەرمووێ (كفى بالمرء كذباً أن يحدث بكل ماسمع) بۆیە ئەو کەسەش بەشێکی لەو تاوانەی درۆ کردنی بەر دەکەوێت هەر وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە. کە ئەوەی گوێ بیستی شتێك دەبێ ودەست بەجێ دەگێڕێتەوە وەك ... کە دەینووسێتەوە، بۆیە ئەویش دەکەوێتە ناو گێژاوی تاوانەکە وبەیەکی

نه درۆزنەکان دەژمێردرێ چونکە هی یەکەم هەڵی بەستاوە، وەهی دووهەمیش شەنەبای بۆ کردووە !!

دیسان (ابن حبان) [ڕەحمەتی خوای لێبێ] دەڵێت: لەو فەرموودەیەدا* بە ئاگا خستنەوەیەك هەیە بۆ ئەوانەی گوێ بیستی قسەیەك دەبن وەدەیگێڕنەوە تارەکو زانیاری تەواو بەرامبەر ساغی فەرموودەکە بەدەست دەهێنێت .. هەروەکو ئیمام (النووي) یش ووتویەتی (ئەوەی زانیاری تەواوی بەرامبەر فەرموودەیەکەوە نەبێ بۆی نیە دەستی پێوە بگرێت وبیکات بەبەڵگە) بەبێ لەبەر چاو گرتنی توێژینەوەی زانستی لەبەرامبەر فەرموودەکە دەبێت ئەو کەسە فەرموودەکە بپشکنێ ئەگەر هاتوو زانیاری پێ هەبوو، ئەگەر نا پێویستە ئەو کارە بخاتە ژێر دەستی (ئەهلی عیلم) و لەم ڕووەوە پرسیاری لێ بکات. (٢٠)

... بۆیە لە ئەنجامی توێژینەوەی ڕاو بۆچونەکانی ئەو چەند کۆمەڵە زانایە ورەچاوکردنی بەڵگەو مەرجەکانیان ئەوا تەنها ڕاستیەك دەرك پێ دەکەین کە: دیارە فەرموودەی لاواز لە بەشێکی فەرموودە واز لێهێنراوەکانە ودەست پێ وەرگرتنی سەر دەکێشێ بۆ تاوانی درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ ویاسا بڕیاردان ووەرگرتنی ئاینە لە غەیری سەرچاوەی ئیسلام!! لەبەر ئەوە داخستنی دەرگای

---

* واتە: فەرموودەی (كفى بالمرء كذباً أن يحدث بكل ما سمع) رواه مسلم (١/٥ ص١٠) بترقيم محمد فؤاد عبد الباقي .

کارکردن بەفەرمووده لاوازەکان پێویستە ڕەچاى لێ بکرێت لە پێناوى بەرژەوەندى گشتى ئیسلام وبۆ بەرۆگۆتنەوە لەسەر هەڵدانى خراپەکارى و( سداً للذريعـــة) (٢١)

**وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.**

** ** ** ** **

# ژێدەرەکـــانـی پـــاشــکۆ

١- **سەیرى** (( قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث ) )ى محمد جمال الدين القاسمي ل١١٦ **بکە، ئەویش لە** (( عيون الأثر ) )ى ابن سيد الناس **وەرى گرتووە.**

٢- **سەیرى** ((فتح المغيث بشرح ألفية الحديث)) السخاوي، و((دراسة في مصطلـــح الحديـــث)) ى براهيم النعمة ل١٢٣، **وپێشەکى کتێبى** ((تمام المنة في التعليق على فقه السنة)) ل٣٤ **بکە نووسینى** الشيخ محمد ناصر الدين الألباني.

٣- ((قواعد التحديث ....)) ل ١١٦، **وپێشەکى** ((تمام المنة...)) ل٣٤.

٤- ((دراسة في مصطلح الحديث )) ل١٢٣.

٥- ((قواعد التحديث ...)) ل ١١٦،١٢٠،١٢١.

٦- ((علم الحديث))ى شيخ الإسلام ابن تيمية ل ٢٠ ,مجموع الفتـاوى (ب١٨/ل٢٥) **هى ناوبراو،** و((إعلام الموقعين...)) ابن القيم الجوزية (ب١/ل٣١-٣٢)((قواعد التحديـــث) ل١٢١ **ئەویش لە کتێبى** ((منهاج السنة)) ابن تيمية **نەقڵى کردوە.**

٧- ((قواعد التحديث)) ل١٩
٨- ((دراسة في ...)) ل ١٢٤/١٢٥، ((علوم الحديث)) ابن الصلاح ل ٩٣، ((لمحات في أصول الحديث والبلاغة النبوية)) ل١٩٩،((قواعد التحديث))ل١١٧
٩- أخرجه البيهقي في ((المدخل)) ، ((فتح المغيث...)) (ب١/ ل١٤٢) ، ((قواعد التحديث ...)) ل ١١٧ وه هەر لەكتێبی (( قواعد التحديث)) رای هەر يەكە لەم زانايانە بخوێنەوە هەمان لاپەرە.
١٠- بۆ زیاتر حاڵی بوون لەم مەرجانەی باسكراون سەربدە بەم سەرچاوانەی خوارەوە:-
((تدريب الراوي)): السيوطي (ب١/ ل٢٩٨-٢٩٩).
((فتح المغيث)): (ب١/ ل ٢٦٨)
أ. ((نزهة النظر مع ما عليها من تعليقات ...)): (ل ٥٤).
((الأذكار مع مختصر من شرح ابن علان)): (ل ٧).((تيسير مصطلح الحديث)): (ل ٦٤) د.محمود الطحان.
((مصطلح الحديث)): (ل ١٢) محمد بن صالح العثيمين.
١١- (( قواعد التحديث))ل١٢٤،١٢٥. ((المجموع شرح المهذب))(١/٦٣) النووي
١٢- ((دراسة في مصطلح الحديث)): (ل ١٢٦).
١٣- پێشەكی ((تمام المنة ...)): (ل٤٠).
١٤- ((مصطلح الحديث)): (ل ١٢).
١٥- لەكتێبی: ((الباعث على إنكار البدع والحوادث)): (ل ٥٤)، ((تمام المنة))ل٣٢.
١٦- رواه مسلم (ب ١/ل ٩)، وابن ماجه (ب١/ ل ٣٨،٣٩،٤٠،٤١) ((مشكاة المصابيح)): (١/١٩٩).
١٧- پێشەكی ((تمام المنة ....)): (ل ٣٢،٣٣).
١٨- لە ((الصارم المنكي)): (ل ١٦٥/١٦٦) دا هاتووە.
١٩- أخرجه ابن ابي شبة (٨/٧٦٠) وأحمد وغيرهما: ((السلسلة الصحيحة)): (١٧٥٣).
٢٠- ((صحيح مسلم بشرح النووي)): (٦٠)، ((قواعد التحديث)): (ل ١١٨).
٢١- ((دراسة في ...)): (ل ١٢٦).